# بەروبوومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتەکانی الله سبحانه وتعالی



ئامادەکردنی :


• الشاب السني •


١٤٤٥ هـ

بسم الله الرحمن الرحیم

بزانە اللە ﷻ من و تۆش تەوفیق بدات بۆ عیلم بە صیفەتەکانی اللە ﷻ وە ئیمان پێهێنانی بەو شێوەیەی شایستەی خۆیەتی ﷻ، تێڕامان لێی کۆمەڵێک بەروبوومی گەورە و سوودی نایاب جێدەهێڵێت، وا دەکات خاوەنەکەی شیرینی ئیمان بچێژێت، کە کەسانێکی زۆر لە موعەطیلە و تەئویلکەر و موشەبیهە لێی بێ بەشن، هەندێک لەوانەش :

## ١ - لە بەرو بوومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتەکانی اللە عز و جل :

بەندە دەزانێت کە اللە ﷻ وەک چۆن ناوەکان و صیفەتەکانی خۆش دەوێت ئاواش ئاسەوار و واجباتەکانی خۆش دەوێت : تاکە و تاکیی خۆش دەوێت، جوانە و جوانیی خۆش دەوێت، لێبووردەیە و لێبووردنی خۆش دەوێت، سوپاس کراوە و سوپاسکراویی خۆش دەوێت، بەخشەرە و ئەهلی بەخشینی خۆش دەوێت، شەرمندەیە و ئەهلی شەرمی خۆی دەوێت، داپۆشەرە و ئەهلی داپۆشینی خۆش دەوێت، بەهێزە و ئیماندارانی بەهێزی خۆش دەوێت، زانایە و ئەهلی عیلمی لە بەندەکانی خۆش دەوێت،

چاکەکارە و چاکەکارانی خۆش دەوێت، دادگەرە و ئەهلی عەدلی خۆش دەوێت، ڕێنموونیکارە و ئەهلی هیدایەتی خۆش دەوێت.

**٢ - وە لەوە :**

کاتێک بەندە ئیمانی هێنا بە صیفەتی خۆشویستن و خۆشەویستی الله ﷻ وە ئەو ﷻ بەڕەحم و میهرەبانە دڵنیا دەبێت لە پەروەردگار، وە لێی نزیک دەبێتەوە بەوەی خۆشەویستی و میهرەبانی زیاد دەکات (بەردەوام بەندە لێم نزیک دەبێتەوە بە سوننەتەکان تا خۆشم دەوێت) وە هەوڵ دەدات ببێت بە یەکێک لەوانەی الله دەربارەیان دەفەرمووێت : (ئەی جبریل من فلان کەسم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بوێت، جبریل یش خۆشی دەوێت، دواتر بانگ دەکات لە ئاسمان : الله فلان کەسی خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێت، ئەهلی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت، دواتر لەسەر زەویش قبوڵ دەکرێت) .

وە لە ئاسەواری ئیمان بەم صیفەتە مەزنە ئەوەیە ئەوەی بیەوێت خۆشەویست بێت لای الله شوێن پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەوێت | **قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ** | (آل عمران : ٣١) وە خۆشەویستی الله ﷻ بۆ بەندە پەیوەستە بە خۆشەویستی بەندە بۆ الله ﷻ، کاتێک داری خۆشەویستی ڕواند لە دڵ، وە ئاوی دا بە ئیخلاص، وە شوێن

خۆشەویست ﷺ کەوت بەردەگرێت بە جۆرەها بەروبووم، هەموو کاتێک کە کاتی خۆی هات بەویستی پەروەردگاری بەروبووم دەدات.

**٣ - وە لەوە:**

کاتێک ئیمانی هێنا بە صیفەتەکانی عیلم و دەورەدان و لەگەڵبوون، ئەوە ئاسەواری ترس بەجێدەهێڵێت بەوەی کە الله ﷻ بەسەریەوە چاودێر و شاهیدە، کاتێک ئیمان هێنا بە صیفەتی بیستن، دەزانێت الله ﷻ دەیبیستێت، لەبەر ئەوە هیچ ناڵێت جگە لە خێر نەبێت .

کاتێک ئیمانی هێنا بە صیفەتەکانی بینین و چاوپێکەوتن و تێڕوانین و چاو، دەزانێت الله ﷻ دەیبینێت، هیچ ناکات جگە لە خێر نەبێت، ئەی چی بۆ بەندەیەک دەزانێت کە الله ﷻ دەیبیستێت و دەیبینێت، وە دەزانێت چی دەڵێت و چی دەکات، ئایا بۆ ئەم بەندەیە شیاوە کە الله ﷻ نەیدۆزێتەوە لەو شوێنەی نەهی لێ کردووە، وە لەو شوێنەی فەرمانی پێ کردووە بیری نەکات ؟

کاتێک ئەم بەندەیە زانی وە ئیمانی هێنا کە الله ﷻ خۆشەویستی هەیە و ڕازی دەبێت،کاردەکات بەوەی پەرستراو و خۆشەویستەکەی خۆشی دەوێت و پێی ڕازیە،کاتێک ئیمانی هێنا بە صیفەتەکانی تورەیی و ڕق و لەعنەت و سزا، کاردەکات بەوەی مەولاکەی تووڕە ناکات و ڕقی

هەڵناسێنێت تا لێی تورە نەبێت و سزای بدات و دواتر لەعنەتی لێبکات و دووری بخاتەوە لە ڕەحمەتی خۆی .

کاتێک ئیمانی هێنا بە صیفەتەکانی ئاسودەیی و زەردەخەنە و پێکەنین ئارام دەبێتەوە بەو پەروەردگارەی کە ئاسوودە دەبێت بە بەندەکانی و زەردەخەنەیان بۆ دەکات و بۆیان پێدەکەنێت، چ شتێکی باشمان هەیە لە پەروەردگارێک کە پێدەکەنێت.

**٤ ـ وە لەوە :**

کاتێک بەندە زانی و ئیمانی هێنا بە صیفەتەکانی اللە ﷻ لە (ڕەحمەت و تەوبەوەرگرتن و نەرمونیانی و لێبووردن و لێخۆشبوون و داپۆشین و وەڵامدانەوەی دوعا) هەرکاتێک کەوتە تاوانەوە، داوا لە اللە ﷻ دەکات کە ڕەحمی پێ بکات و لێی خۆش بێت و تەوبەی لێ وەربگرێت، وە خوازیاری ئەوەیە لە اللە لە داپۆشین و نەرمونیانی بە بەندە ئیماندارەکانی .

گەڕانەوە قبوڵ دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای اللە ﷻ لەهەر تاوانێکدا، وە هیچ ڕێگایەک بۆ بێ ئومێدی نابینێتەوە لە دڵیدا، چۆن بێ ئومێد دەبێت کەسێک ئیمانی هەبێت بە صیفەتەکانی (ئارامگرتن و لەسەرخۆیی) چۆن بێ ئومێد دەبێت لە ڕەحمەتی اللە کەسێک کە بزانێت اللە وەصف دەکرێت بە صیفەتی (ڕێز و بەخشندەیی و بەخشین)؟!.

**٥ ـ وەلەوە:**

بەندەیەک کە دەزانێت اللە ﷻ وەصف کراوە بە صیفەتەکانی (شکاندن و زاڵبوون و دەسەڵات و توانا و زۆرلێکردن) دەزانێت کە اللە ﷻ هیچ دەستەوەستانی ناکات، ئەو توانای هەیە کە زەوی بە ناخدا بدات، وە سزای بدات لە دونیا پێش قیامەت، وە ئەو زاڵە بەسەر بەندەکانی، وە ئەو سەردەکەوێت بەسەر ئەوەی بیەوێت سەربکەوێت، خاوەن مەلەکوت و زۆرلێکردن و دەسەڵاتێکی هەتاهەتاییە، پاک و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری مەزن.

**٦ ـ وەلە بەروبوومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتەکانی اللە ﷻ :**

بەندە هەمیشە لەژێر سێبەری داواکردنە لە پەروەردگاری، ئەگەر تاوانی کرد؛ داوای لێ دەکات بە صیفەتەکانی (ڕەحمەت و تەوبە و لێبووردن و لێخۆش بوون) کە ڕەحمی پێ بکات و تەوبەی لێ قبوڵ بکات و لێی ببورێت و لێی خۆش بێت .

وە ئەگەر ترسا لەسەر نەفسی خۆی لە دوژمنێکی هێرشکەری زۆردار؛ داوای لێ دەکات بە صیفەتەکانی (هێز و زاڵبوون و دەسەڵات و زۆرلێکردن) دەستی بەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان، دەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەی خاوەن هێز و دەسەڵات و زۆرلێکردن، بمپارێزە .

ئەگەر ئیمانی هێنا بەوەی الله ﷻ (کەفیلە و پارێزەرە و بەسە و وەکیلە) دەڵێت : حسبنا الله ونعم الوکیل، وە پشت دەبەستێ بە (تاک و تەنها) .

وە زانی الله ﷻ خاوەن (عیززەت و توندی و هێزە) رێگری لێ دەکات لە دووژمنەکانی، وە پێی ناگەن ئیللا بە ویستی ئەو نەبێت .

کاتێک توشی فەقیری دەبێت؛ داوا لە الله ﷻ دەکات بە صیفەتەکانی (دەوڵەمەندی و رێز و بەخشین)، کاتێک توشی نەخۆشی دەبێت؛ داوای لێ دەکات لەبەرئەوەی ئەو (چارەسەرکەر و شیفادەرە و بەسە) .

کاتێک منداڵی نابێت، داوا لە الله ﷻ دەکات کە رِزقی بدات و نەوەی صالحی پێ ببەخشێ، لەبەرئەوەی ئەو (رِزقدەرە و بەخشەرە) . . .

بەم شێوەیەش لەبەر ئەوەی لە بەروبومەکانی عیلم بە صیفەتەکانی الله ﷻ و ئیمان هێنان پێیان داواکردنە لێی پێیان.

**٧ - وە لەوە :**

بەندە کاتێک تێرِادەمێنێت لە صیفەتەکانی الله ﷻ لە (مەزنی و بەرِێزی و هێز و زۆرلێکردن) خۆی بەکەم دەزانێت، زەلیلی خۆی دەزانێت .

وە کاتێک زانی الله ﷻ تایبەتە بە صیفەتی (خۆبەگەورەزانین)؛ خۆی بە گەورە دانانێت بەرامبەر کەس، وە بەربەرەکانێ ناکات لەگەڵ الله ﷻ لەو صیفەتانەی تایبەتی کردووە بە خۆی .

وە کاتێک زانی الله ﷻ وەصف کراوە بە صیفەتی (دەوڵەمەندی و موڵک و بەخشین) هەست بە موحتاجی خۆی دەکات لای مەولا دەوڵەمەندەکەی، خاوەن موڵک، بە ئەو کەسەی دەبەخشێ ئەوەی بیەوێت .

**٨ - وە لەوە:**

کاتێک زانی الله ﷻ وەصف دەکرێت بە صیفەتی (هێز و عیززەت و زاڵبوون) وە ئیمانی پێ هێنا، دەزانێ هێزی بۆ دێت لە هێزی الله، وە عیززەتی بۆ دێت لە عیززەتی الله، زەلیل و سەرشۆڕ نابێت بۆ کافر، وە دەزانێ ئەگەر لەگەڵ الله ﷻ بێت الله ش ﷻ لەگەڵیدایە، وە هیچ کەسێک بەسەر فەرمانیدا سەرناکەوێت .

**٩ - وە لە بەرو بوومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتەکانی الله ﷻ :**

بەندە بەربەرەکانێ ناکات لەگەڵ الله ﷻ لە صیفەتی (حوکم و پەروەردگارێتی و شەرع دانان و حەلاڵ کردن و حەڕام کردن)؛ حوکم ناکات ئیللا بەوەی الله ﷻ دایبەزاندووە، وە حوکم ناباتەوە ئیللا بۆلای

ئەوەی الله ﷻ دایبەزاندووە، وە ئەوە حەڕام ناکات کە الله ﷻ حەڵاڵی کردووە، وە ئەوە حەڵاڵ ناکات کە الله ﷻ حەڕامی کردووە.

**١٠ - وە لەوە:**

صیفەتەکانی (مەکر و گاڵتەپێکردن) کاتێک ئیمانی پێ هێنا لەسەر ئەو شێوەی کە شایستەی بە زاتی الله ﷻ، دەزانێت کەس ناتوانێت فێڵ لە الله ﷻ بکات و فریوی بدات، وە ئەو باشترین هەڵوەشێنەرەوەی فێڵەکانە، وەک چۆن کەس لە درووستکراوەکانی ناتوانن گاڵتەی پێ بکەن و فێڵی لێ بکەن، لەبەرئەوەی الله ﷻ گاڵتەی پێ دەکات وە لە ئاسەواری گاڵتەپێکردنی الله ﷻ بە بەندەیەک ئەوەیە تورە دەبێت لێی و سزای دەدات، ئیمان هێنان بەم صیفەتانە پارێزەری بەندەیە لە کەوتنە ژێر تورەیی و سزای الله ﷻ .

**١١** - بەندە سورە لەسەر ئەوەی پەروەردگاری لەبیر نەکات و واز لە یادی نەهێنێت، الله وەصف کراوە بە صیفەتی (وازلێهێنان)؛ الله بەتوانایە بەسەر ئەوەی لەبیری بکات واتا وازی لێ بهێنێت، ﴿ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ ﴾ **(التوبة: ٦٧)**، بەردەوام فەرمان و ڕێگریەکانی ئەو بەبیر خۆی دێنێتەوە.

**١٢ - وە لەوە:**

بەندە کاتێک دەزانێت کە اللە ﷻ وەصف کراوە بە صیفەتی (سەلام و ڕاستگۆیی)؛ ئەوە هەست بە ئارامی و دڵنیایی نەفسی دەکات، اللە ﷻ سەلامە، وە سەلامی خۆش دەوێت، وە سەلام لە نێوان ئیمانداران بڵاودەکاتەوە، ئەوە ئەو ئیمانداره درووستکراوەکان پارێزراون لە ستەمی .

کاتێک بەندە باوەڕی وابوو اللە ﷻ وەصف کراوە بە صیفەتی (ڕاستگۆیی)، وە ئەو بەڵێنی ئەو بەهەشتەی پێداوە کە لەژێریەوە ڕووبارەکان دەڕۆن ئەگەر کاری باش بکات؛ دەزانێ اللە ﷻ ڕاستگۆیە لە بەڵێنەکانی، دوای ناخات و لێی لانادات، ئەمە وای لێ دەکات گوێڕایەڵیەکانی زیاد بکات، گوێڕایەڵی بەندەیەکی ئیشکەر بۆ خاوەنەکەی وادەکات کرێکەی پێ بدات و بەوەفا بێت بەرامبەر حەقەکەی.

**١٣ - وە لەوە:**

صیفەتەکانی وەك: (ڕوو، دوو دەستەکان، پەنجەکان، سەرە پەنجەکان، دوو پێیەکان، لاق، وە جگە لەمانەش) هەرکەس ئیمانی پێ هێنا و بەڕاستی دانا لەسەر ئەو شێوەیەی شایستەیە بە اللە ﷻ بەبێ تەشبیه و لێکچواندن و تەحریف و چۆنێتی بۆ دانان، وە بڵێت : هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، جیاوازی ناکەین لە جێگیرکردنی

صیفەتی ژیان و عیلم و توانا لەگەڵ ئەم صیفەتانە، هەرکەس ئەمە ئیمان و بیروباوەڕی بێت ئەوە براوەیە بە بردنەوەیەکی گەورە .

وە هەرکەس عەقڵە نەخۆشەکەی پێشخست بەسەر نەقڵی صەحیحدا و تەئویلی ئەم صیفەتانەی کرد و داینا لەسەر مەجاز و تەحریفی کرد و پەکی خست، ئەوا دۆڕاوە بە دۆڕانێکی ئاشکرا .

ئەگەر جیاوازی کرد لە نێوان صیفەتێک و صیفەتێکی تر، وە الله ی ﷻ بەدرۆ خستەوە لەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە، وە نێردراوەکەی بەدرۆ خستەوە، هیچ بەروبوومی نابێت تا نەچێتە ڕیزی ئیماندارانی یەکخواپەرست .

کاتێک ئیمانت هێنا کە الله ﷻ ڕووی هەیە بەوەی شایستەی خۆیەتی، وە سەیرکردن بۆی لە گەورەترین نیعمەتەکانە کە الله ﷻ دەیبەخشێت بە بەندەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا، وە بەڵێنی داوە بە بەندە صالحەکانی داوای سەیرکردنی ڕووی پیرۆزی بکەن پێیان ببەخشێت.

وە کاتێک ئیمانت هێنا کە الله ﷻ دەستێکی پڕی هەیە کە هەرگیز بەخشین کەم ناکات، وە خێر لەنێو دەستیایەتی، داوای ئەوەی نێو دەستی لێ دەکەیت، وە کاتێک زانیت دڵت لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الله ﷻ دایە، داوای لێ دەکەیت کە دڵت لەسەر دینەکەی جێگیر بکات.

### ١٤ - وە لە بەروبوومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتەکانی اللە :

بەدورگرتنی اللە یە لە کەموکورِیەکان و پیرۆز ڕاگرتنیەتی، وە وەصف کردنیەتی بە صیفەتە کەمالەکان، هەرکەس زانی لە صیفەتەکانی (پیرۆز و پاکوبێگەردە)؛ اللە بەدووردەگرێت لە هەموو عەیب و کەموکورِیەک، وە دەزانێت اللە | لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ | (الشورى : ١١).

### ١٥ - وە لەوە :

هەرکەس زانی صیفەتەکانی (ژیان و مانەوە)؛ دەزانێت خوایەک دەپەرستێت کە نامرێت، وە خەوی لێ ناکەوێت و خەوەنوچکە نایگرێتەوە، ئاسەواری ئەمە خۆشەویستی و بەگەورە ڕاگرتن و ڕێزدانانە بۆ ئەو خوایەی ئەمانە صیفەتی بن.

**١٦** - وە لە بەروبومەکانی ئیمان هێنان بە صیفەتی (بڵندێتی، لەسەروو بوون، بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرِش، دابەزین، نزیک بوونەوە، نزیک کردنەوە)؛ بەندە دەزانێت اللە ﷻ بەدوورە لەوەی تێکەڵی درووستکراوەکانی ببێت، وە ئەو لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، وە ئاگاداری هەموو شتێکە، جیایە لە درووستکراوەکانی، دانیشتووە لەسەر عەرِشەکەی، وە ئەو لە بەندەکەی نزیکە بە عیلمەکەی، کاتێک بەندە پێویستی بە پەروەردگاری بوو، دەبینێت نزیکە لێوەی، داوای لێ دەکات، ئەویش وەڵامی دوعاکەی دەداتەوە، دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دوونیا لە

سێیەکی شەودا بەوەی شایستەی خۆیەتی، دەفەرمووێت : (کێ بانگم دەکات وەڵامی بدەمەوە)، بەروبومی ئەمە ئەوەیە بەندە سور دەبێت لەسەر گەڕان بەدوای ئەو کاتانەی کە بەتەنها دەبێتەوە لەگەڵ پەروەردگاری.

**١٧ - وەلەوە :**

ئیمان هێنان بە صیفەتی (کەلام) وە قورئان کەلامی الله یە ﷻ وا دەکات بەندە هەستی پێ بکات کاتێک قورئان دەخوێنێت واتا کەلامی الله ﷻ دەخوێنێت، کاتێک ئەمەی خوێندەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾ (الانفطار: ٦)؛ هەست دەکات کە الله ﷻ قسەی بۆ دەکات و بۆی دەگێڕێتەوە، دڵی دەفڕێت بۆی، وە کاتێک ئیمانی هێنا بەم صیفەتە، وە خوێندوویەتیەوە لە فەرموودەی صەحیحدا کە الله ﷻ قسەی لەگەڵدا دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، لە نێوان ئەو و خۆیدا وەرگێڕێک نیە، شەرم دەکات سەرپێچی الله ﷻ بکات لە دوونیادا، وە وەڵام ئامادە دەکات بۆ ئەو حساب و پرسیارکردنە.

لە کۆتاییدا دەڵێین هیچ صیفەتێکی الله ﷻ نیە ئیللا ئیمان هێنان پێی ئاسەواری گەورەی هەیە، وە ئەم ئاسەوارە گەورانە ئیمان جێگیر دەکەن، چ نیعمەتێکی گەورەیە بەسەر ئەهلی سوننە و جەماعەوە کە الله

ﷻ وای لێ کردوون ئیمان بهێنن بە هەموو ئەوانە لەسەر ئەو شێوەیەی شایستەیە بە زاتی خۆی.